


# التَّجوِيدُ المُصَوَّرُ

## به كوردی

گشت یاساکانی تەجوید بە وێنە و
ڕوونکردنەوە لە خۆ دەگرێت

الدُّكتُورُ أيمَن رُشدِي سُوَيد






ناوی كتێب : التجويد المصور بە كوردی

نووسەر : د . أَيْمَنْ رُشْدِي سُوَيْد

وەرگێڕانی : م . عبدالحميد بەرزنجی

پێداچوونەوە : م . عبدالجبار ابراهيم بابانی

تایپ : فريد لطيف عزت

دیزاین : باوەڕ كەمال قادر
fb.com/bawar.kemal

پێوانەی پەڕە : ١٧,٥ x ٢٥ سم

بۆ دەستكەوتنی ئەم بەرهەمە بە تاك و بە كۆ پەیوەندی بكە

بەم ژمارە مۆبایلەوە : ٠٧٥٠ ٧٤٩ ٨٢ ١٦



لە بەڕێوبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان ژمارە سپاردنی(١٣٣٢)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە



الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# پێشەکی

وەرگێڕانی شاکارێکی گرنگ و بەپێزی وەک کتێبی ( التجويد المصور ) ی شێخی پایە بەرز ( د . أيمَن رُشْدي سُويَد) کە لە ئەو پەڕی دانایی و وردەکاریدا ئەنجامدراوە ، کارێکی ئاسان و بێ ئاستەنگ نیە کە بتوانرێت بەهەمان ئەو نەخشەسازی و دیزاین و داڕشتنانەوە داڕێژرێتەوە سەر زمانی کوردی ، ئەگەر لە دوای پشتیوانی خوای گەورەو بێ هاوتا ، ماندوبوون و لە خۆبوردەیی کۆمەڵێک مامۆستای شارەزای ئەو بوارانە نەبوایە کە دڵسۆزانە تێدەکۆشان بێ بەرامبەر و لە هەوڵی شەو و ڕۆژدا بوون .

ئەم شاکارە بۆتە ستاندەرێکی دروست و وردی جیهانی لەلای زۆربەی مسوڵمانان و جێگەی متمانە و دڵنیاییانە ، لەبەر ئەوەی بەشی زۆری یاساو بوارو شێوە جیاوازەکانی زانستی جوان خوێندنەوەی قوڕئانی پیرۆزی تیا ئاماژە پێدراوە لە ئەو پەڕی وردەکاری و جوان داڕشتنی بابەتەکان و ئەندازەسازی خشتەو وێنەکانیدا ، کە جێگەی سەر سوڕمانە و شایەنی دوعای خێرن.

# پێشەکی

ئـەم بەرهەمـە بـە نرخـە مەڵۆیەکـی گـەورەو پڕبایەخـە لـە خەرمانـی گەنجینـەی کتێبخانـەی کوردیـدا و جێگـەی شانازی یە بۆ هەموو مسوڵمانێکی کورد ، لەبەر ئەوەی بابەتەکانی باس لە جوان خوێندنەوەو ڕاست دەربڕینی وتەی شیرین و پاراوی (رَبُّ الْعَالَمِين ) دەکات و هەوڵدراوە بەئاسانترین شێوە بخرێتە بەردەستی خوێنەری کورد و خۆپارێزی کـراوە لـە وشەسـازی و بەکارهێنانـی وشـەی داتـاشراو لـە پێنـاوی گەیاندنـی مـاددە زانسـتیەکە کـە مەبەستی سەرەکییە .

خـوای گـەورە پاداشـتی بەخێـری دڵسـۆزان و خەمخۆرانـی ئـەم کارە گـەورە و گرنگـە بداتـەوە بـە تایبـەت بـرای بەڕێزمـان کاک ( بـاوەڕ کەمـال قـادر ) کـە دیزایـن و وێنەکانـی ئامادەکـردووە ، وە کاک (فریـد لطیـف عـزت) کـە نوسینەوەکەی بە کۆمپیوتەر ئامادەکردووە ، وە مامۆستای بەڕێز و خۆشەویست مامۆستا (عبدالجبار ابراهيم) ئەرکی پیاداچونەوەکەی گرتەئەستۆی خۆی ، لە پاش فەزڵی خوای گەورە بە هـەوڵ ماندووبونی ئـەم بەڕێزانە کارەکـە بەرهـەم هاتـوو کەوتـە دەسـتی خوێنەرانـی . خـوای گـەورە و میهرەبـان بیکاتـە توێشـوی قیامـەت بـۆ هەموو لایەك و بە ئەهلی قورئان بمانژمێرێت . اَللّٰهُمَّ آمِين

وەرگێڕ


الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# دليل القارئ إلى أبواب الكتاب







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# ڕێبەری خوێنەر بۆ باسەکانی ئەم کتێبە



# القُرآنُ الكَرِيمُ

- تعريفُ القرآنِ الكريم ومعنى التواتُر
- كيفَ بلَّغَ النَّبيُّ ﷺ القرآنَ للأُمَّة
- مراحلُ تدوينِ القرآنِ الكريم
- النَّقلُ الصَّوتيُّ للقرآنِ الكريم
- أحدُ أسانيدِ المؤلِّفِ المتَّصلةِ بتلاوة القرآن إلى النبيِّ ﷺ




الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# قورئانی پیرۆز

پێناسەی قورئانی پیرۆز و واتای فرەگێڕانەوە (التَّوَاتُر)

چۆن پێغەمبەر ﷺ قورئانی پیرۆزی گەیاندووە

قۆناغەکانی نوسینەوەی قورئانی پیرۆز

گواستنەوە و گەیاندنی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز

یەکێک لە ڕشتە نەپچڕاوەکانی دانەر بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز تا پێغەمبەر ﷺ



الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# تعريف القرآن الكريم

هو كلامُ اللهِ تعالىٰ المُعجِزُ، المُنَزَّلُ علىٰ قلبِ نبيِّنا محمدٍ ﷺ ، المُتَعَبَّدُ بتلاوتِه ، المكتوبُ بينَ الدَّفَّتَين ، المنقولُ إلينا بالتواتُر، المُتَحَدَّىٰ بأقصَرِ سورةٍ منه .




الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# پێناسەی قورئانی پیرۆز



فەرمایشــت و وتــەی خــودای گەورەیــە ، کەمــرۆڤ وجنۆکــە دەســتەوســانن لــە نمونــەی ئــەو بێنــن ، کــە دابەزێــنراوە بــۆ ســەر دڵــی پێغەمبەرمــان محمــد ﷺ ، خوێندنــەوەی خواپەرســتییە ، و لەنێــوان دوو بەرگــدا پارێــزراوە ، و پەیتــا پەیتــا و دەماو دەم گواستراوەتەوە بۆمان ، و تەحەدداى تیایە بە کورتترین سورەتی.







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# التَّوَاتُرُ



هو النَّقْلُ المُستَفيض لخبرٍ مِنَ الأخبار، طَبَقةً بعدَ طَبَقة، مِن أوَّلِ الإِسنادِ إلىٰ آخِرِه، بحيثُ يُحيلُ العقلُ اجتماعَ كُلِّ الرُّواةِ علىٰ الكَذِب.





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# فرەگێڕانەوە (التَّوَاتُرُ)

بریتییە لە گواستنەوەی بەربڵاو و بەلێشاوی هەواڵێک لەهەواڵەکان ، چین لە دوای چین ، لە سەرەتای ڕشتەکەوە تاکۆتاییەکەی ، بەشێوەیەک لای کەس ژێر ئەستەمە هەموو هەواڵگێڕەوەکان کۆبوبنەوە لەسەر درۆ .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# كيف بلَّغ النبي ﷺ القرآن الكريم

بلَّغ رسولُ اللهِ ﷺ الأُمَّةَ القرآنَ العظيمَ **بطريقَين** :

١- **مكتوبًا** ( مُدوَّنًا ) .

٢- **مَنطُوقًا** ( النَّقلُ الصَّوتيُّ ) .

وقد وصلَنا القُرآنُ بالطريقَينِ السابقتَينِ **متواترًا** .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# چۆن پێغەمبەر ﷺ قورئانی پیرۆزی گەیاندووە



پێغەمبەر ﷺ بە دوو ڕێگا قورئانی پیرۆزی گەیاندووە :

١- بەشێوەی نوسراو .

٢- بەشێوەی خوێنراو .

وەبەڕاستی قورئانی پیرۆز بە هەردوو ڕێگاکەی سەرەوە بە فرەگێڕانەوە پێمانگەشتووە .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# مَرَاحِلُ تَدْوِينِ القُرْآنِ الكَرِيمِ



١- كتابةُ كُلِّ مقطَعٍ فَوْرَ نُزولِهِ بينَ يدَيِ النبيِّ ﷺ والوَحيُ حاضِر.











# قۆناغەکانی نوسینەوەی قورئانی پیرۆز

١- **نوسینەوەی هەربەشێک لە قورئانی پیرۆز لەکاتی دابەزینیدا لەبەردەستی پێغەمبەردا ﷺ.**

















# مَراحِلُ تَدوينِ القُرآنِ الكَريمِ

قَالَ زَيْدُ بنُ ثَابِتٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ :

(( كُنتُ أَكْتُبُ ٱلْوَحْيَ عِنْدَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُمْلِي عَلَيَّ فَإِذَا فَرَغْتُ قَالَ : ٱقْرَأْ ، فَأَقْرَؤُهُ ، فَإِنْ كَانَ فِيهِ سَقَطٌ أَقَامَهُ ، ثُمَّ أَخْرُجُ بِهِ إِلَى ٱلنَّاسِ )) .

رَوَاهُ ٱلطَّبَرَانِيُّ بِسَنَدٍ رِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# قۆناغەکانی نوسینەوەی قورئانی پیرۆز



**زەیدی کوڕی ثابت ﵁ فەرمویەتی :**

**(( من کاتێک (وەحی)م دەنوسیەوە لای پێغەمبەری خودا ﷺ ، بۆی دەخوێندمەوە تاتەواو دەبووم ، پاشان دەیفەرموو : بخوێنەرەوە ، منیش بۆم دەخوێندەوە ، ئەگەر هەڵەیەکی تیابوایە بۆی چاك دەکردم ، پاشان بۆ خەڵکم دەخوێندەوە )) .**

رَوَاهُ الطَّبَرَانِىُّ بِسنَدٍ رِجَالُهُ مُوَثَّقُونَ













الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

٢- تفريغُ الكتابةِ السابقةِ في صُحُفٍ، زَمَنَ أبي بكرٍ الصِّدِّيق رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



٢- كۆكردنەوەی نوسینەكانی پێشوو لە پەڕاوێكدا لە سەردەمی پێشەوا ئەبو بەكری صدیق دا رضي الله عنه .









الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# مَرَاحِلُ تَدْوِينِ القُرْآنِ الكَرِيمِ

٣ - نسخُ عِدَّةِ مصاحفَ مِنَ الصُّحُفِ السابقةِ

زَمَنَ عثمانَ بنِ عفَّانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



٣- لەبەرگرتنەوەی چەند پەڕاوێک لەپەڕاوەکەی پێشوو لەسەردەمی پێشەوا عوثمانی کوڕی عەفان دا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# مَراحِلُ تدوينِ القرآنِ الكريمِ

أَرسلَ عثمانُ رَضِيَ اللهُ عَنهُ مُصحفًا مِن المصاحفِ السَّابقةِ إلى كلِّ مِصرٍ من أمصارِ المسلمينَ مع قارئٍ مُتقنٍ يُقرِئُ النَّاس .









الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# قۆناغەکانی نوسینەوەی قورئانی پیرۆز



پێشەوا (عوثمان) رضي الله عنه هەرپەڕاوێکی لە پەڕاوەکانی پێشوو نارد بۆ هەر ناوچەیەک لە ناوچەکانی مسوڵمانان لەگەڵ قورئانخوێنێکی شارەزا تا فێریان بکات.












الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# مَراحِلُ تدوينِ القرآنِ الكريمِ

٤ - كتابةُ المسلمينَ لنُسَخٍ لا تُحصَى مِنَ المصاحفِ السابقةِ .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



٤- نوسینەوەی چەندین نوسخەی تر لە لایەن مسوڵمانانەوە کە لە هەژمار نایەت لەبەر پەڕاوەکانی پێشوودا .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

## ٥ - ظُهورُ مُؤلَّفاتٍ تَضبطُ خصائصَ الكتابةِ القُرآنيَّة (عِلمُ رَسمِ المصاحف).






٥- نوسینی چەندین پەرتوك كەتایبەتمەندییەكانی نوسینەوەی قورئان ڕێكدەخات ( زانستی وێنەی پیتەكانی قورئان )





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# النَّقلُ الصَّوتيُّ للقرآنِ الكريمِ



١- نَزلَ **جبريلُ** عليه السلام بالقرآنِ العظيمِ على **قلبِ النبيِّ** صلى الله عليه وسلم بألفاظِه ومعانيهِ وكُلِّ ما يتعلَّقُ به .

٢- تَلقَّى **الصحابةُ** الكرامُ مِن **فَمِ رسولِ اللهِ** صلى الله عليه وسلم القرآنَ وأَعادُوه أمامَه ، حتَّى **أَقرَّهم** عليه .

٣- نقلَ **أصحابُ رسولِ اللهِ** صلى الله عليه وسلم القرآنَ إلى **مَنْ بعدَهم** بالطريقةِ نفسِها ، وهكذا حتَّى **وصلَ إلينا** .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# گواستنەوە و گەیاندنی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز

١- جبریل عليه السلام قورئانی پیرۆزی دابەزاند بۆ سەر دڵی پێغەمبەری خودا ﷺ بەهەموو ئەو دەربڕین و مانایانەی پەیوەستن بەقورئانی پیرۆزەوە .

٢- هاوەڵە بەڕێزەکانیش قورئانیان لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرت و لەبەردەمیدا وتویانەتەوە تا پەسەندی کردووە .

٣- هاوەڵەکانی پێغەمبەریش ﷺ بەهەمان ئەو شێوەیەی کە لە پێغەمبەری خودایان ﷺ بیستووە گەیاندوویانە بەدوای خۆیان ، وەبەم شێوازە تا گەیشتووە بە ئێمە .




الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner




## شُيوخيَ الذينَ قرأتُ عليهمُ القرآنَ العظيم




الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

أيمن رشدي سويد

عامر السيد عثمان
توفي ١٤٠٨هـ

إبراهيم شحاتة السمنودي
توفي ١٤٢٩هـ

أحمد الزيات
توفي ١٤٢٤هـ

عبد العزيز عيون السود
توفي ١٣٩٩هـ

محمد بن طه سكر
توفي ١٤٢٩هـ

محيي الدين الكردي
توفي ١٤٣٠هـ


ئەو مامۆستایانەی لەخزمەتیاندا قورئانم خوێندووە




الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# أَحَدُ الأَسَانِيدِ المُتَّصِلَةِ لِلقُرآنِ الكَرِيمِ

# بِرِوَايَةِ حَفصٍ عَن عَاصِمٍ مِن طَرِيقِ الشَّاطِبِيَّةِ





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# یەکێک لە ڕشتە نەپچڕاوەکانی قورئانی پیرۆز

# بەڕیوایەتی (حەفص لە عاصم )ەوە لەڕێگای ( شاطبي ) یەوە

رب العزة جل جلاله

جبريل عليه السلام

سيدنا رسول الله صلى الله عليه وسلم — توفي بأبي وأمي سنة ١١هـ

١ زيد بن ثابت رضي الله عنه — توفي ٤٥هـ

٢ عبد الله بن حبيب السلمي — توفي ٧٤هـ

٣ عاصم بن أبي النجود — توفي ١٢٧هـ

٤ حفص بن سليمان البزاز — توفي ١٨٠هـ

٥ عبيد بن الصباح النهشلي — توفي ٢٣٥هـ

٦ أحمد بن سهل الأشناني — توفي ٣٠٧هـ

٧ علي بن محمد الهاشمي — توفي ٣٦٨هـ

٨ طاهر بن عبد المنعم بن غلبون — توفي ٣٩٩هـ

٩ أبو عمرو عثمان بن سعيد الداني — توفي ٤٤٤هـ

١٠ أبو داود سليمان بن نجاح — توفي ٤٩٦هـ

١١ علي بن محمد بن هذيل — توفي ٥٦٤هـ

١٢ القاسم بن فيره الشاطبي — توفي ٥٩٠هـ

١٣ علي بن شجاع العباسي — توفي ٦٦١هـ

١٤ محمد بن أحمد الصائغ — توفي ٧٢٥هـ

١٥ عبد الرحمن بن أحمد البغدادي — توفي ٧٨١هـ

١٦ محمد بن محمد بن محمد الجزري — توفي ٨٣٣هـ

١٧ أحمد بن أسد الأميوطي — توفي ٨٧٢هـ

١٨ محمد بن إبراهيم السمديسي — توفي ٩٣٢هـ

١٩ علي بن محمد بن غانم المقدسي — توفي ١٠٠٤هـ

٢٠ عبد الرحمن بن شحاذة اليمني — توفي ١٠٥٠هـ

٢١ محمد بن قاسم البقري — توفي ١١١١هـ

٢٢ أحمد بن رجب البقري — توفي ١١٨٩هـ

٢٣ عبد الرحمن بن حسن الأجهوري — توفي ١١٩٨هـ

٢٤ إبراهيم بن بدوي بن أحمد العبيدي — كان حيا ١٢٣٧هـ

٢٥ أحمد بن رمضان المرزوقي — توفي ١٢٦٢هـ

٢٦ أحمد بن محمد الرفاعي الحلواني — توفي ١٣٠٧هـ

٢٧ محمد سليم الرفاعي الحلواني — توفي ١٣٦٣هـ

٢٨ عبد العزيز عيون السود — توفي ١٣٩٩هـ

أيمن رشدي سويد





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

## قال تعالى في كتابه العزيز

# ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

## خودای گەورە لە قورئانی بەرزو بەرێزدا فەرموویەتی

ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا

لەپاشان کەسانێکمان کردەخاوەن و ڕاگەیەنەری ئەم قورئانە
کە هەڵمان بژاردوون لە بەندەکانمان






الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# كَانَ الشَّيخُ عَبدُ العَزِيزِ عُيُونُ السُّودِ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى

**عندما يَذكرُ هذا الإسنادَ يقول :**

هَٰذَا أَعَزُّ سَنَدٍ فِي الدُّنْيَا    رُتْبَـتُهُ بِالاتِّـفَاقِ الْعُـلْيَـا

لِمِثْلِهِ يُرْحَلُ شَامًا وَيَمَنْ    وَقَدْ أَتَانَا سَائِغًا بِلَا ثَمَنْ





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

مامۆستای پایەبەرز (عَبْدُالْعَزِيزِ عُيُونُ ٱلسُّود) رەحمەتی خودای لێبێت

## کاتێک باسی ئەم ڕشتە دەکات دەفەرموێت

هَٰذَا أَعَزُّ سَنَدٍ فِي الدُّنْيَا رُتْبَتُهُ بِالاتِّفَاقِ الْعُلْيَا

لِمِثْلِهِ يُرْحَلُ شَامًا وَيَمَنْ وَقَدْ أَتَانَا سَائِغًا بِلَا ثَمَنْ

ئەمە بەڕێزترین ڕشتەیە لە دنیادا ڕێزبەندییەکەی بەهاوکاری پایە بەرزەکانە

بۆ نمونەی ئەمە گەشتی شام ویەمەن کراوە وەگەیشتووە بە ئێمە بە دروستی و بە بێ پارە





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# عِلمُ التَّجويدِ

## تعريفُ عِلمِ التَّجويد

## اللَّحنُ في تلاوةِ القرآنِ الكريم

## حُكمُ الِالتزامِ بالتَّجويد

## حُكمُ قراءةِ القرآنِ الكريمِ بالألحانِ الموسيقيَّة

## سُرعاتُ التِّلاوة





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# زانستی تەجوید

پێناسەی زانستی تەجوید

هەڵەکردن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز

حوکمی پەیوەست بوون بەتەجویدەوە

حوکمی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە ئاوازەکانی مۆسیقا

شێوازەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز



# تَعريفُ التَّجويدِ



**التَّجويدُ في اللُّغة :** التَّحسين .

جَوَّدَ ، يُجَوِّدُ : حَسَّنَ ، يُحَسِّنُ .

**وفي الِاصطلاح :** هو عِلمٌ يُعرَفُ به النُّطقُ الصحيحُ للحروفِ العربيَّة ، وذلك بمعرفةِ مخارجِها ، وصفاتِها الذاتيَّةِ والعَرَضيَّة ، وما ينشأُ عنها مِن أحكام .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# پێناسەی تەجوید



تەجوید لە زمانەوانیدا واتا : جوانکردن .

وە لەزاراوەدا : ئەو زانستەیەکە بەهۆیەوە دەربڕینی ڕاست و دروستی پیتەکانی عەرەبی دەزانرێت، ئەوەش بە ناسینی شوێنی دەرچونی پیتەکان و سیفاتە خودی و توشبوەکان ، و ئەو یاسایانەی کە بە هۆیەوە دروست دەبن .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# تَعرِيفُ التَّجوِيدِ

**قال الإمامُ ابنُ الجزريِّ في النشر :** « ولا أعلمُ سببًا لبُلوغِ نهايةِ الإتقانِ والتجويد ، ووصولِ غايةِ التصحيحِ والتسديد مثلَ رياضةِ الألسُنِ ، والتكرارِ على اللفظِ المُتلقَّى من فَمِ المُحسِنِ . . فليس التجويدُ بتمضيغِ اللِّسان ، ولا بتَقعيرِ الفَمِ ، ولا بتعويجِ الفَكِّ ، ولا بترعيدِ الصوت ، ولا بتمطيطِ الشَّدِّ ، ولا بتقطيعِ المدِّ =





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# پێناسەی تەجوید

پێشـەوا (ابـن الجـزری) لـە کتێبـی (النـشر) دا فەرمووویەتـی : (( هیچ هۆکارێك نابینمەوە بـۆ گەیشـتن بـە ئەوپـەڕی وردەکاری لەجـوان خوێندنـەوەی قورئـان ، و ئەوپـەڕی ڕاسـتی ودروسـتی لـە دەربڕینـی وشـەکانی قورئـان وەکـو خۆڕاهێنانـی زوبـان ، و بـەردەوام وتنەوەی لای کەسی شارەزا .

کەواتـە جـوان خوێندنـەوەی قورئـان بـە جوینـەوەی پیتـەکان نییـە لەنـاو دەمـدا ، وەنـە بـە چاڵکردنـی دەم ، وە نـە بـە لارکردنـەوەی چەناگـە ، وە نەبـە لەرزاندنـی دەنـگ ، وە نـە بـە درێژکردنەوەی شەددە ، وە نە بە پچڕاندنی مەد =







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



= ولا بتطنينِ الغُنَّات ، ولا بحَصْرَمةِ الراءاتِ ، قراءةً تَنفِرُ عنها الطِّباعُ ، وتَمُجُّها القلوبُ والأسماع ، بل القراءةُ السهلةُ العذبةُ الحُلوةُ اللطيفة : التي لا مَضْغَ فيها ولا لَوْكَ ، ولا تعسُّفَ ولا تكلُّفَ ، ولا تصنُّعَ ولا تنطُّعَ ، ولا تَخرُج عن طباعِ العربِ وكلامِ الفُصَحاء ، بوجهٍ من وجوهِ القراءاتِ والأداء » اهـ .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# پێناسەی تەجوید

= وە نە بە لەراندنەوەی مینگەکان ، وەنەبە توندکردنەوەی ڕائەکان نیە ، هەروەها خوێندنەوەیەک نییە کە سروشتی مرۆڤ بێزار بکات ، وە حەز لە گوێگرتن و دڵدانپێی نەبێت ، بەڵکو خوێندنەوەیەك بێت ئاسان و پاراو و شیرین و لەسەر خۆ بێت :

کە زۆر لەخۆکردن و خۆماندوکردنی تیانەبێت ، وە بەشێوەیەک بێت لە سروشتی عەرەب و وتەی پاراو دەرنەچێت ، وە بە شێوەیەك بێت لە شێوەکانی خوێندنەوە باوەکان .







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# أَهَمُّ مَبَاحِثِ عِلْمِ التَّجْوِيدِ

- مخارجُ الحروفِ العربيَّة .
- الصفاتُ الذاتيَّةُ للحروف .
- الصِّفاتُ العَرَضِيَّة ، وأهمُّها :

- إدغامُ الحرفَينِ المتماثِلَينِ والمُتَجانِسَين .
- أحكامُ اللَّامِ الشَّمسيَّةِ والقَمَريَّة .
- أحكامُ الميم الساكنة .
- أحكامُ النُّونِ الساكنةِ والتنوين .
- أحكامُ المدِّ والقَصر .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# گرنگترین باسەکانی زانستی تەجوید

- شوێنی دەرچونی پیتەکانی عەرەبی .
- سیفاتە خۆییەکانی پیتەکان.
- سیفاتە توشبووەکان ، کە گرنگترینیان ئەمانەن :

- تێهەڵکێشانی دوو پیتی لەیەکچوو یان هاوڕەگەز .

- حوکمەکانی لامی شەمسی و لامی قەمەری .

- حوکمەکانی میمی زەنەدار .

- حوکمەکانی نونی زەنەدار وتەنوین .

- حوکمەکانی درێژکردنەوەو کورتکردنەوە .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# اللحن في تلاوة القرآن الكريم

**اللَّحنُ لُغةً** : المَيلُ عن الصَّواب .

**واصطلاحًا**: الخطأُ في تلاوةِ القرآنِ الكريم .

وينقَسِمُ إلىٰ **قِسمَين** :

١ – اللَّحنُ **الجَلِيُّ** .  ٢ – اللَّحنُ **الخَفِيُّ** .



# هەڵەکردن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا

هەڵەکردن لە زمانەوانیدا واتە : لادان لەوەی کە ڕاست و دروستە .

بەڵام لە زاراوەدا : بریتییە لە هەڵەکردن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا.

ئەمەش دەکرێت بە دوو بەشەوە :

١- هەڵەی ئاشکرا .

٢- هەڵەی شاراوە.







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# اللَّحنُ في تِلاوةِ القُرآنِ الكَريمِ



١- **اللَّحنُ الجَلِيُّ** : هوَ خطأٌ يَعرِضُ لِلَّفظِ فيُخِلُّ بالمعنىٰ أو بالإعراب ، نحو :

( أَنْعَمْتُ عَلَيْهِمْ ) ، ( فَكَسَّرَكُمْ ) بدلَ ﴿ فَكَثَّرَكُمْ ﴾

( عَصَىٰ ) بدلَ ﴿عَسَىٰ﴾ ، ( بِسْمِ اللهُ الرَّحْمَـٰنَ الرَّحِيمِ )





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# هەڵەکردن لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا

١- هەڵەی ئاشکرا : ئەو هەڵەیەیە کە لە دەربڕینی وشەیەکدا دروست دەبێت و دەبێتە هۆی تێکدانی ماناکەی یان ئیعرابەکەی ، وەکو :

(أَنْعَمْتُ عَلَيْهِمْ) ، (فَكَسَّرَكُمْ) لەبری ﴿فَكَثَّرَكُمْ﴾

(عَصَىٰ) لەبری ﴿عَسَىٰ﴾ ، (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ)



# اللحن في تلاوة القرآن الكريم



٢- **اللَّحنُ الخَفِيُّ** : هو خطأٌ يَعرِضُ لِلَّفظِ فَيُخِلُّ بكمالِ صفاتهِ دونَ أن يُخرِجَه عن حَيِّزه ، نحو :

﴿ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ ﴾ بِتَركِ زِيادَةِ المدِّ في الواو .

﴿ أَنفُسِكُمۡ ﴾ بإظهارِ النُّونِ .

ولا بُدَّ أنْ تكونَ التِّلاوةُ ( **في مَقامِ التَّلَقِّي والمُشافَهة** ) سالمةً من كِلا اللَّحْنَين .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



**٢- هەڵەی شاراوە :** ئەو هەڵەیەیە کە لە دەربڕینی وشەیەکدا دروست دەبێت و دەبێتە هۆی تێکدانی جوانی وتەواوی دەربڕینی سیفاتی پیتەکانی بە بێ ئەوەی ماناو ئیعرابی تێکبدات ، وەکو:

﴿سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ﴾ مەدی واوەکە نەکرێت .

﴿ أَنفُسِكُمۡ ﴾ نونەکە ئاشکرابکرێت .

پێویستە خوێندنی قورئان لەکاتی ( وەرگرتنی دەم بەدەم لای مامۆستا ) هیچ کام لەم دوو هەڵەیەی تێدانەبێت.





# حكمُ الالتزامِ بالتَّجويدِ

النَّاسُ في هذا الأمرِ بينَ مُتشَدِّدٍ ومُتساهِلٍ ، وحتى يكونَ الكلامُ دقيقًا فإنَّنا نُفرِّقُ فيه بينَ ما يلي :

## ١- مخارجُ الحروف :

الِالتزامُ بها واجبٌ ، **والإخلالُ بها حرامٌ مطلقًا** ، كتغييرِ حاءِ ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾ بالخاءِ أو بالهاء .



# حوكمی پەیوەست بوون بە تەجویدەوە

بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی تەجوید هەیە زۆر توند و هەیە ئاسانکارە ، جا بۆ ئەوەی قسەکەمان وردبێت پێویستە ئەم جیاکاری یە لە نێوانیاندا بکەین .

## ١- لەبارەی دەرچەی پیتەکان :

پێویستە بەڕاستی دەرببڕێت ، وە هەر هەڵەیەک تیایدا حەرام و نادروستە ، وەکو گۆڕینی (حاء) لە ﴿ٱلرَّحۡمَـٰنِ﴾ بە خاء یان بە هاء.





## ٢- صفاتُ الحروف ، وتنقسمُ إلىٰ قسمَين :

### أ- صفاتٌ تغييرُها يُخرِجُ الحرفَ عن حَيِّزه :

الِالتزامُ بها واجبٌ ، **والإخلالُ بها حرامٌ مطلقًا**

كتفخيمِ سينِ ﴿ عَسَىٰ ﴾ وترقيقِ صادِ ﴿عَصَىٰ ﴾

وترقيقِ طاءِ ﴿ ٱلطَّلَٰقُ ﴾ وتفخيمِ تاءِ ﴿ ٱلتَّلَاقِ ﴾





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner





## ٢- لەبارەی سیفاتی پیتەکان ، دەکرێن بە دوو بەشەوە :

أ- ئەو سیفەتانەی گۆڕانکاری تیایاندا دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای وشەکان :

ڕاست دەربڕینیان پێویست و واجبە ، هەر هەڵەیەک تیایاندا حەرامە و نادروستە

وەکو :

قەڵەوکردنی سین لە ﴿ عَسَىٰ ﴾ وە ناسککردنی صاد لە ﴿ عَصَىٰ ﴾

وە ناسککردنی طاء لە ﴿ ٱلطَّلَٰقَ ﴾ وە قەڵەو کردنی تاء لە ﴿ ٱلتَّلَاقِ ﴾







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



## ب - صفاتٌ تزيينيَّةٌ تحسينيَّة :

كترقيقِ الراءِ المفتوحةِ والمضمومةِ نحو : ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ وعدمِ تبيينِ الهمسِ والتفشِّي ، وعدمِ تطويلِ زمنِ الحرفِ الرِّخوِ الساكنِ مُقارنةً بالشديد ، وكلِّ ما اصطلحَ عليه العلماءُ باسمِ اللَّحنِ الخفيِّ ، **فيُفرَّقُ فيه بين حالتَين :**





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# حوکمی پەیوەست بوون بە تەجویدەوە

## ب -  سیفاتە جوانکارییەکان :

وەکو ناسککردنی (ڕاء) کاتێک (فەتحە یان ضەمە) ی هەبێت  وەکو :

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾

یان دەرنەکەوتنی سیفەتی (الهمس و التفشی) ، یان درێژنەکردنەوەی ماوەی پیتی (الرِّخو ) کاتێک زەنەدار بێت بەبەراورد لەگەڵ دەربڕینی پیتێکی تر کە سیفەتی ( الشِّدَّة ) ی هەبێت ، وە هەموو ئەوانەش کە زانایان ناویان ناوە هەڵەی شاراوە ، کەواتە پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان ئەم دوو حاڵەتەدا:







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# حُكمُ الالتِزامِ بالتَّجويدِ



أ - علىٰ سبيلِ التلقِّي والمشافهة :

الِالتزامُ بها واجبٌ ، **والإخلالُ بها حرامٌ** ؛ لأنَّه كذبٌ في الرِّواية .

ب - علىٰ سبيلِ التلاوةِ المعتادة : **يُفرَّقُ فيه بين حالتَين :**

١- من شخصٍ مُتقنٍ عالمٍ بالأحكام : **مَعيبٌ** في حَقِّه .

٢- من عامَّة المسلمين : تَرَكَ الأكملَ و**لا شيءَ عليه** .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# حوکمی پەیوەست بوون بە تەجویدەوە



أ- لەکاتی وەرگرتن و وتنەوەدا :

پێویستە گۆڕانکارییان تیادا نەکرێت ، و ڕوودانی هەڵە تیایاندا حەرام و نادروستە ، چونکە دەبێتە درۆ لە ڕیوایەتدا .

ب - لە کاتی خوێندنەوەی ئاساییدا ، ئەمیش دوو حاڵەتی هەیە :

١) بۆ کەسی شارەزاو زانا بە حوکمەکان : نەنگی و عەیبەیە .

٢) بۆ موسڵمانان بە گشتی : وازی لە باشترین شێوەی خوێندنەوە هێناوە ، بەڵام هیچی لەسەر نییە .



# حُكمُ الالتزامِ بالتجويدِ



**مخارج الحروف**

الِالتزامُ بها واجبٌ
والإِخلالُ بها حرامٌ
مُطلقًا

**صفات الحروف**

**صفاتٌ تَغييرُها يُخرِجُ الحرفَ عن حَيِّزه :**

الِالتزامُ بها واجبٌ
والإخلالُ بها
حرامٌ مُطلقًا

**صفاتٌ تزيينيَّة تحسينيَّة : يُفرَّقُ فيها بين حالتَين :**

**علىٰ سبيل التلقِّي والمشافهة :**

الِالتزامُ بها واجبٌ
والإخلالُ بها حرامٌ
لأنَّه كَذِبٌ في الرِّواية

**علىٰ سبيل التلاوة المعتادة**

**مِن مُتقِنٍ عالِمٍ بالأحكام**

مَعيبٌ في حقِّه

**من عامَّة المسلمين**

تَرْكَ الأكملَ
ولا شيءَ عليه





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# حوكمی پەیوەست بوون بە تەجویدەوە

## دەرچەی پیتەكان

پابەند بوون پێیانەوە پێویست و واجبە – بەهەڵە خوێندنەوەی بەهەرشێوەیەك بێت نادروستە

## سیفاتی پیتەكان

### ئەو سیفەتانەی بە گۆڕینیان واتاکەی تێک دەچێت :

پابەند بوون پێیانەوە پێویست و واجبە – بەهەڵە خوێندنەوەی بە هەر شێوەیەك بێت نادروستە.

### سیفاتە جوانكاریەكان : ئەمیش دوو حاڵەتی هەیە :

#### لەكاتی وەرگرتن و وتنەوەدا :

پێویستە گۆڕانكاری یان تیادا نەكرێت و ڕودانی هەڵە تیایاندا حەرام و نا دروستە , چونكە دەبێتە درۆ لە ڕیوایەت دا

#### لە كاتی خوێندنەوەی ئاسایی دا

بۆ كەسی شارەزاو زانا بە حوكمەكان نەنگی و عەیبەیە

بۆ مسوڵمانان بە گشتی وازی لە باشترین شێوەی خوێندنەوە هێناوە ,بەڵام هیچی لەسەر نی یە







الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner

# حكمُ قراءةِ القرآنِ الكريمِ بالألحانِ

**الموسيقا** : علمٌ صوتيٌّ أعجميٌّ ، له قواعدُه وضوابطُه ، ومِن أَهَمِّ أبحاثِه :

١ - **طبقاتُ الصَّوتِ** المختلفة .
٢ - **أزمنة التطويل** .

وهذانِ المبحثانِ يتقاطعان مع **عِلم التجويد** :

أمَّا **الطبقاتُ الصَّوتيَّة** : فلا مانع من أن ينتقل قارئ القرآن من طبقةٍ إلى أُخرى ، إذا كان ذلك من حرفٍ إلى حرف .





الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# حوكمی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە ئاوازەوە

مۆسیقا : زانستێکی دەنگییە ، و یاسا و ڕێسای خۆی هەیە ، وە لە گرنگترین باسەکانی :

١.ئاستە جیاوازەکانی دەنگ .    ٢. ماوەی درێژکردنەوە .

وە ئەم دوو باسە لەگەڵ زانستی تەجویدیش یەکدەگرێتەوە:

سەبارەت بە ئاستە جیاوازەکانی دەنگ : هیچ ڕێگرییەک نییە قورئانخوێن لە ئاستێکی دەنگییەوە بچێتە ئاستێکی دەنگی تر ، ئەگەر لە پیتێکەوە بچێت بۆ پیتێکی تر .



# حكم قراءة القرآن الكريم بالألحان

وأمَّا ضِمْنَ الحرفِ الواحد - كحروف المدِّ والغُنَّات - فعلى القارئ أن يَلتزِمَ في الواحد منها بطبقةٍ صوتيَّةٍ واحدة ؛ لأنَّ الإخلال بذلك يُقَطِّعُ الحرفَ إلى حروفٍ عديدة ، وقد نَهى الأئمَّةُ عن ذلك .

وأمَّا تَطويلُ المدودِ والغُنَن : فعلى القارئ أن يَلتزِمَ بالموازين التي ذكرَها الأئمةُ القرَّاءُ في ذلك ، فإنْ أَخلَّ بها مُقدِّمًا الحُكمَ الموسيقيَّ عليها أَثِمَ .




الممسوحة ضوئيا بـ CamScanner



# حوکمی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە ئاوازەوە

بەڵام لەیەک پیتدا وەک پیتەکانی -درێژکردنەوە و مینگە پێویستە- قورئانخوێن بەیەک ئاستی دەنگی بیانخوێنێتەوە، چونکە گۆڕینی ئاستی دەنگی پیتەکە، پیتەکە دەکات بە چەند پیتێک، کە پێشەوایان ئەمەیان قەدەغە کردووە.

بەڵام درێژکردنەوەی مەددەکان ومینگەکان: پێویستە خوێنەر پەیوەست بێت بەو پێوەرانەی کە پێشەوایانی قورئانخوێن دیارییان کردووە، بەڵام ئەگەر ئەو پێوەرانەی تێکدا بۆ ئەوەی یاساکانی مۆسیقا پێش یاساکانی تەجوید بخات گوناهبار دەبێت.